**ناوەندی ڕۆشنبیریی**

**مەم و زین**

- ناوی کتێب: هەژار موکریانی (ژیان و ڕەنگدانەوەی مێژوو لە بەرهەمەکانیدا)
- نووسەر: زامدار ئەحمەد
- نەخشەسازی ناوەوە: ناوەندی مەم و زین
- نەخشەسازی بەرگ: پەپوولە یوسفی
- پێداچوونەوە: سەلاحەددین ئاشتی
- بابەت: توێژینەوە
- نۆبەتی چاپ: یەکەم - ٢٠٢٣
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: ٧٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٢٧٧)ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.



memuzin20@gmail.com

سپاسگوزاری بۆ سەرجەم هاوڕێیانی هێژا، کە هاوکار و یارمەتیدەر
بوون لە نووسین و تەواو کردنی ئەم بەرهەمە، لەوانە:
(دوکتۆر هۆشمەند عەلی، دوکتۆر کەیوان شافعی، دکتۆر ئەنوەر
خالەندی، دکتۆرە میهری پاکزاد، سەلاحەددین ئاشتی)،
کە هەریەکەیان بە جۆر و شێوازێک هاوکار بوون.

# ناوەڕۆک

**پوخته**

هەژار موکریـانی کـارەکتەرێکی دیـاری نێـو دونیـای ئەدەب و فەرهەنـگ و زمـانە، پتـر بە کەسـێکی ئەدەبـی و فەرهەنگـی ناسـراوە، بەڵام ئێمە لە توێژینەوەکەماندا جـودا لەم باسانە جەختمان لە دوو لایەنی دیکەی هەژار موکریانی کردووە، کە کەمتر باسـی کراوە و لە بارەیەوە نووسـراوە، کە ئەمانەن:

یەکەم: هەژار موکریـــانی، وەکـــوو ڕۆژنـــامەوانێکی سـەردەمی خـۆی ڕۆڵ و دەوری بەرچـاوی هەبـووە، لەگەڵ دەرچـــوونی یەکەم بڵاوکـــراوەی کـــۆمەڵەی ژیـــانەوەی کوردســـتان دەســـتی کـــردووە بە بڵاوکـــردنەوەی شـــیعر، هەروەهـــا لە قۆنـــاغی دواتـــر و دامەزرانـــدنی کۆمـــاری کوردستان، هەژار زیاتر ڕۆدەچێتە نێو بواری نووسین و لە بەشێک لە ژمارەکانی ڕۆژنامەی کوردستان وتار و شیعری بڵاوکراوەتەوە، بەشێوەیەک ئەگەر بە وردی سـەرنج بدەینە وتارەکـانی هەژار، وەکـوو ڕۆژنامەوانێـک دێـتە بەرچـاو کە هەواڵ و ڕووداوەکـانی بـۆ خـوێنەر گواسـتۆتەوە. بەدەر لە ماوەی ژیـانی لە ڕۆژهەڵاتـی کوردسـتان، لە دوای ئـاوارەیی و پەناهەنـــدەیی هەژار دیســـانەوە دەســـت بە نووســـین و بڵاوکـــردنەوە دەکـــات، تەنـــانەت پێـــنج ژمـــارەی گۆڤـــاری کوردستان دەردەکات، کە زۆربەی بابەتەکانی نێو گۆڤارەکە

لە نووسینی هەژار بووە. بەدەر لە کارکردنی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بۆ ماوەیەک لە ڕادیۆی شۆڕش کاری کردووە، لەبەرئەوە دەکرێ بڵێین هەژار یەکێکە لە ڕۆژنامەوانەکانی سەردەمی خۆی، ڕۆڵی لە بەرەوپێشبردنی ڕۆژنامەگەری کوردی هەبووە.

دووەم: هەژار موکریانی وەکوو مێژوونووس، بیرەوەری و بەسەرهات و سەرگوزەشتەکانی لە نێو چێشتی مجێور، مێژوو و ڕووداوەکانی ژیانی خۆی و دەوروبەرییەتی، کە ئەمەش لە نێو چوارچێوەی یادداشت و ژیاننامە و بەسەرهاتەکاندا جێگای دەبێتەوە و جێی بایەخە، بابەتەکانی نێو چێشتی مجێوریش لە چوارچێوەی مێژوودایە، بەڵام ئەوەی ئێمە پتر تیشکمان خستووەتەسەر ڕەخنەگرتنە لە بارەی شێوازی تۆمارە مێژووییەکانی هەژار موکریانی، چون لە نووسینەوەی ڕووداوەکاندا وەک پێویست و بە دروستی بابەتەکانی نەگەیاندووە، بەڵکوو چۆنی پێ خۆش بووبێ، ئاوا نووسیویەتی، لەبەرئەوە دەبینین لە زۆر شوێندا زۆر بە توندی لە دژی کەسێک نووسیویەتی، یاخود بە پێچەوانەوە زۆر بە توندی بەرگری لێ کردووە، هەروەها بەشێکی دیکەی لە ڕووداوەکان وەک خۆی نەگێڕاوەتەوە، واتە تا ڕادەیەک ڕووداوە مێژووییەکەی شێواندووە.

هەروەها باسێکی دیکەی نێو توێژینەوەکەمان تیشک خستنەسەر شێوازی وەرگێڕانی هەژارە، کە لە تەرجەمەدا پابەندی دەق نەبووە و بە پێی ویستی خۆی بەشێک لە بابەتەکانی تەرجەمە کردووە.

کلیلی وشەکان: هەژار، مێژوو، ڕۆژنامەگەری، وەرگێڕان، ئەدەبیات.

## پێشەکی

لە نێو ڕەوتی مێژووی کورددا، بە دەیان کەسایەتی دیار بوونیان هەیە، کە لە چەندین بواری جیاوازدا ئەسپی خۆیان تاو داوە و کاریان کردووە و نووسیویانە، یەکێک لەو کەسانە عەبدورڕەحمان شەرەفکەندی (هەژار موکریانی)یە، کە پتر بە شاعیر ناسراوە و ناوبانگی دەرکردووە، لە کاتێکدا ئەگەر بە وردی سەیری بەرهەمە بڵاوکراوەکانی ناوبراو بکەین، دەبینین لە زۆر بابەتی دیکەدا کاری کردووە، دەکرێ بڵێین هەژار بە تەنیا شاعیرێکی ناسراو نییە، بەڵکوو لە چەندین ڕەهەندی دیکەدا کاری کردووە، بە نموونە نووسینەوەی مێژوو، بەتایبەتی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتانەی کە خۆی تێیدا کارەکتەر بووە، هەروەها کەسایەتییەکی سیاسی، کە بەشێکی زۆری ژیانی لە نێو سیاسەتدا بەسەربردووە، هەم لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و هەم لە باشووری کوردستان، هاوکات لە بواری ڕۆژنامەگەریدا جێ دەستی دیارە و لە زۆربەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی سەردەمی خۆی وتار و شیعری بڵاوکراوەتەوە.

لەم تویژینەوەیەدا پشت بە میتۆدی تویژینەوەی زانستی مێژوویی گیراوە، بە بەکارهێنانی سەرچاوە

مێژووییەکـان، هەروەهـا بە گـوێرەی پێویسـتی بابەتەکـان میتـۆدی هەڵسـەنگاندن و بەراورد کـردن و ڕەخنەگـرتن و شرۆڤە کردنیش پەیڕەو کراوە.

ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی لەم شێوەیە بێ گیروگرفت و بـێ کێشــە نــابێ، چــونکە هەژار موکریــانی لە زۆربەی بڵاوکراوەکـــانی ســـەردەمی خـــۆی وتـــار و شـــیعری بڵاوکـــراوەتەوە، دۆزیـــنەوە و پەیـــدا کردنـــی ســـەرجەم نووســـینەکانی ئاســـان نیـــیە، چـــون لە لایەک ئەرشـــیفێکی ڕێـکوپێـک و دروسـت لەم بـارەیەوە بەردەسـت نیـیە، لە لایەکی دیکە، ڕۆشـن نییە کە هەژار لە کـام ڕۆژنـامە و کـام گۆڤارە بابەتی بڵاوکراوەتەوە، هاوکات سـەختی دۆزینەوەی گۆڤـار و ڕۆژنامەکـانی پێشـوو، بەتـایبەت ئەو گۆڤـار و ڕۆژنامـانەی کە وێـنەی دیجیتاڵییـان نیـیە و کۆپییـان لەبەر نەگیراوەتەوە.

ئامانجی نووسینی توێژینەوە، خستنەڕوو و دەرخستنی چەنـد لایەن و ڕەهەنـدێکی جیـاوازی هەژار موکریـانییە، کە تـاکو ئێسـتا باسـی لێوە نەکراوە، یـاخود بە کەمـی ئامـاژەی پێکراوە، بەتایبەتی شێوازی نووسینەوەی مێژوو لای هەژار موکریانی، هەروەها وەرگێڕانی شـەرەفنامە کە جێی ڕەخنە و ســەرنجە و هەژار لە وەرگێڕانـدا دروسـت ئامـانجەکەی

نەپێکاوە، هاوکات دەرخستنی ڕۆڵی هەژارە لە بواری ڕۆژنامەگەریدا.

لەم توێژینەوەیەدا پشتمان بە چەندین سەرچاوەی هەمەچەشنی فارسی و عەرەبی و کوردی بەستووە، هەروەها ڕێژەیەکی زۆر لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی دەروانی هەژار موکریانییمان بەکارهێناوە، کە کۆمەکی زۆری بە توێژینەوەکەمان کردووە، لێرەدا بە کورتی گرنگترین ئەو سەرچاوانە ئاماژە پێدەدەین کە پتر سوودمان لێ وەرگرتووە.

کتێبی چێشتی مجێور، لە نووسینی هەژار موکریانی، یەکێکە لە کتێبە زۆر بەکارهاتووەکانی ئەم توێژینەوەیە، کە ساڵی ١٩٩٨/ ١٩٧٧ بۆ جاری یەکەم لە پاریس بڵاوکراوەتەوە، بەڵام ئێمە پشتمان بە چاپی ئەوەڵی ڕۆژهەڵاتی کوردستان بەستووە، کە ساڵی ٢٠١٣/ ١٣٩٢ بڵاوکراوەی کتێبی کانی لە سنە وەشانی کردووە. هەژار موکریانی لەم کتێبەیدا زۆرینەی بەسەرهات و ڕووداوەکانی ژیانی خۆی باسکردووە و گێڕاوەتەوە، ئەگەرچی لە نووسیندا کەمترین میتۆد بەرچاو دەکەوێ، چون بە شێوەیەکی زانستی نەینووسیوە و ڕووداوەکان و بەسەرهاتەکانی بە ڕیز بە دوای یەکدا نەهێناوە، بەڵام

دواجـــار کـــۆمەکی زۆری بە توێژینەوەکەمـــان گەیانـــدووە، بەتـایبەت لە بەشـی یەکەمـی توێژینەوەکەمـان، پتـر پشـتمان بەم ســـەرچاوەیە بەســـتووە بـــۆ وەرگرتنـــی ژیاننـــامە و ڕووداوەکانی ژیانی هەژار موکریانی.

کتێبی سەرجەم نووسینەکانی مامۆستا هێمن، لە کوێوە بۆ کوێ، لە نووسـینی هـێمن موکریـانی، چاپی ٢٠١٤/ ١٣٩٣ لە هەولێـــر، ئەمەش یەکێکـــی دیـــکەیە لە کتێـــبە زۆر بەکارهاتووەکانی نێو توێژینەوەکەمان، چون هـێمن و هەژار لە منـداڵییەوە بەیەکەوە بـوون و دۆسـت بـوونە و بەیەکەوە خوێنـدوویانە، ئەم بیرەوەرییـانە لە لایەن هـێمن موکریـانی لەم کتێـبەدا تۆمـار کـراوە و بەتـایبەتی بـۆ بەشـی یەکەمـی توێژینەوەکەمان سوودمان لێ وەرگرتووە.

کتێبی شەرەفنامە لە نووسینی میر شەرەفخان بدلیسـی و وەرگێڕانی هەژار موکریانی، یەکێکی دیکەیە لە کتێبە زۆر بەکارهاتووەکانی نێو توێژینەوەکەمان، چـون بەراوردی ئەم کتێبەمـان کـردووە بە دەقـی ڕەسـەنی کتێـبە فارسـییەکە، کە هەژار لە ڕووی فارســییەوە تەرجەمەی کــردووە، ئــێمەش پشـتمان بە چـاپی شەشـەمی کتێـبەکە بەسـتووە کە سـاڵی ٢٠١٣/ ١٣٩٢ لە لایەن پەخشـــــانگای پـــــانیز لە ســـــنە بڵاوکراوەتەوە.

کتێبی هەژار لە سنە، کە لە بنەچەدا کۆی گشتی وتارەکانی (کۆنگرەی دوو ڕۆژەی یادمانی مامۆستا هەژار لە سنە)ی تێدایە، کە ساڵی ٢٠٠٩/ ١٣٨٨ لە سنە بەڕێوەچووە و دوو ساڵ دواتر بە شێوەی کتێب بڵاوکراوەتەوە، کە توێژینەوەکانی فرە ڕەهەندە و لە زۆر بوار و لایەنی باسکراوە.

کتێبی هەژاری مرۆڤ و دەوروبەری لە نووسینی شێرکۆی کوڕی هەژار موکریانی، کە ساڵی ٢٠٠٨/ ١٣٨٧ بڵاوکراوەتەوە، هەژار موکریانی لەم بەرگەی کتێبەکەیدا کە تایبەتە بە باوکی، ڕەخنەی لە زۆر لایەنی هەژاری باوکی گرتووە و بە وردی لە بارەی نووسراوەکان و بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی هەژار دواوە و بەشێک لە ڕووداوە مێژووییەکانی هەژاری باوکی ڕاست کردووەتەوە.

گۆڤاری نیشتمان، وەکوو بڵاوکراوەی فەرمی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان ١٩٤٣/ ١٣٢٢، کە هەژار بابەتی تێدا بڵاوکراوەتەوە، سەرجەم ئەو ژمارانەی هەژار بابەتی لە نێودا هەبووە، بەکارمان هێناوە.

ڕۆژنامەی کوردستان، وەکوو بڵاوکراوەی فەرمی دەورانی کۆماری کوردستان ١٩٤٥/ ١٣٢٤، جێی بڵاوکردنەوەی وتار و بابەتەکانی هەژار موکریانی بووە،

کۆی گشتی ئەو ژمارانەی هەژار بابەتی لێ بڵاوکراوەتەوە، بەکارمان هێناوە.

گۆڤـــاری مەهابـــاد، یەکـــێکە لە گۆڤـــارە زۆر بەکارهاتووەکـانی نێـو توێژینەوەکەمـان، سـوودمان لە زۆر وتـــار و بـــابەتی نێـــو ژمـــارە جیاوازەکـــانی گۆڤـــارەکە وەرگرتـــووە، کە بەشـــێکیان بـــابەتی هەژاری تێـــدا بـــووە، بەشـێکی دیـکەی وتارەکـان لە بـارەی هەژار موکریـانییەوە نووسراوە.

گۆڤـــاری ســـروە، یەکێکـــی دیـــکەیە لە گۆڤـــارە بە سـوودەکانی توێژینەوەکەمـان، بە هەمـان شـێوەی گۆڤـاری مەهـاد سـوودمان لـێ وەرگرتـووە، چ بە وتارەکـانی هەژار خۆی، چ بەو وتارانەی لە بارەی هەژارەوە نووسراوە.

گۆڤـاری (کیهـان فەرهەنگـی)، لە ژمـارە پێنجـی سـاڵی ١٩٨٨/ ١٣٦٧ وتـــــوویژێکی تێروتەســـــەلی لەگەڵ هەژار موکریانی بە ناونیشانی (استاد عبدرحمان شرفکندی مترجم و شــاعر کـرد) ئەنجـام داوە، کە ئەمەش زۆر کـۆمەکی بە توێژینەوەکەمان گەیاندووە.

هەروەهـا بە مەبەسـتی وەرگرتنـی زانیـاری زیـاتر و نەبیســـتراو، چەنـــد چاوپێکەوتنێـــک لەگەڵ نزیکەکـــان و

دۆستەکانی هەژار موکریانی ئەنجام دراوە، کە لە چەندین لایەنی جیاوازەوە سەبارەت بە هەژار قسە کراوە.

توێژینەوەکە لە پێشەکی و چوار بەش پێکهاتووە و بە ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان کۆتایی هاتووە.

بەشی یەکەم: ژیان و سەرەتای چالاکییەکانی هەژار موکریانی، کە سێ باسی لەخۆ گرتووە.

باسی یەکەم: ژیاننامەی هەژار موکریانی، کە چەند تەوەرێکی لەخۆ گرتووە، لەوانە: ژیانی هەژار لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، خوێندنی هەژار موکریانی، ژیانی ئاوارەیی هەژار موکریانی، گەشتەکانی هەژار موکریانی لە عێراقەوە بۆ دەرەوەی وڵات، گەڕانەوەی هەژار موکریانی بۆ ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئێران.

باسی دووەم: پەیوەندی هەژار موکریانی بە پارت و ڕێکخراوەکان، دوو تەوەری لەخۆگرتووە، ئەوانیش پەیوەندی هەژار موکریانی بە کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان (ژ- ک) و پەیوەندی هەژار موکریانی بە حیزبی دیموکراتی کوردستانە.

باسی سێیەم: ئەدەب و شیعر لای هەژار موکریانی، کە لەم باسەدا سەرەتا و دەستپێکی نووسینی شیعر و تێکەڵاوبوونی بە ئەدەبیات خراوەتەڕوو، هەروەها پەیوەندی

هەژار بە شاعیرانی هاوسەردەمی خۆیەوە لایەنێکی دیکەی باسەکەیە.

بەشـــی دووەم: مێــژووی ڕۆژنـــامەگەری کــوردی و نووســینەکانی هەژار لە بڵاوکراوەکــان، ســێ باســی لەخــۆ گرتووە.

باســـی یەکەم: مێــژووی ڕۆژنـــامەگەری کــوردی، کە کــورتە مێژوویەکــی ڕۆژنــامەگەری کــوردی و ســـەرەتا و دەرکەوتنی چاپ و چامەنی لە نێو کورددا باس کراوە.

باســـــی دووەم: بەرهەمەکـــــانی هەژار موکریـــــانی لە ڕۆژنامەکانـــدا، کە تێیـــدا زۆربەی وتـــار و شـــیعرەکانی هەژارمان خستۆتەڕوو کە لە دەورانی خۆی لە ڕۆژنامەی کوردســتانی دەورانــی کۆمــاری کوردســتان و ڕۆژنــامەی کوردستانی تاران بڵاوی کردۆتەوە.

باســـی ســـێیەم: بەرهەمەکـــانی هەژار موکریـــانی لە گۆڤارەکانـــدا، کە ســـەرجەم وتـــار و شـــیعرەکانی هەژار موکریانی تێدایە کە کاتی خۆی لە گۆڤارەکانی ڕۆژهەڵاتی کوردســتان و باشــووری کوردســتان بــڵاوی کــردۆتەوە، کە ئەمــانەن: (نیشــتمان، هــاواری کــورد، ئــاوات، کوردســتان، هەڵاڵە، گڕوگــاڵی منـداڵانی کـورد، دەنگـی گێتـی تـازە، هیـوا، ڕزگاری، ڕۆنـاهی، کوردسـتان، نووسـەری کـورد، پەروەردە

و زانست، کۆڕی زانیاری کورد، سروە، مامۆستای کورد، مەهاباد و هەولێر).

بەشی سێیەم: بەرهەمە نووسراو و وەرگێڕدراوەکانی هەژار موکریانی، دوو باسی لەخۆ گرتووە.

باسی یەکەم: بەرهەمە نووسراوەکانی هەژار موکریانی، کە سەرجەم بەرهەمە نووسراوەکانی خراوەتەڕوو و شرۆڤەی کراوە، کە ئەمانەن: (ئاڵەکۆک، بەیتی سەرەمەڕ، بۆ کوردستان، هەنبانە بۆرینە، چێشتی مجێور).

باسی دووەم: بەرهەمە وەرگێڕدراوەکانی هەژار موکریانی، کە ئەمەش بە هەمان شێوە خوێندنەوە بۆ سەرجەم ئەو بەرهەمانە کراوە کە هەژار موکریانی وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، کە ئەمانەن: (مەم و زینی خانی، چوارینەکانی خەییام، یەک لە پەنای خاڵ و سیفری بێ برانەوە، ئاریێ برا! وا رابرا! عیرفان، بەرامبەری، ئازادی، دایە! باوە! کێ خراوە؟ شەرەفنامە، هۆزی لەبیرکراوی گاوان و گاوانییە بەناوبانگەکان، دیوانی عارفی ربانی شێخ احمدی جزیری مشهور بە مەلای جزیری، پێنج ئەنگوست دەبنە یەک مست، اثار البلاد و اخبار العباد، قانون در طب، مێژووی ئەردەڵان، قورئانی پیرۆز، تاریخ

سلیمانییە، روابط فرهنگی ایران و مصر)، هەروەها سۆراغ و وردەکاری تەواو سەبارەت بەو کتێبانەشی خراوەتەڕوو کە کاتی خۆی تەرجەمەی کردوون، بەڵام تا ئێستا چاپ نەکراوە.

بەشی چوارەم: نووسینەوەی مێژوو لای هەژار موکریانی کە سێ باسی لەخۆ گرتووە.

باسی یەکەم: مێژوو لە چێشتی مجێوردا، دوو بابەتی تێدا جێکراوەتەوە، یەکەم: ڕووداوە مێژووییەکانی پەیوەست بە کوردانی باشووری کوردستان، دووەم: ڕووداوە مێژووییەکانی پەیوەست بە کوردانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، کە لەم باسەدا تۆمارە مێژووییەکانی هەژار موکریانی بەراورد کراوە بە هەمان ڕووداو لە دیدی نووسەر و مێژوونووسێکی دیکەی هاوسەردەم و دەقی تۆمارە مێژووییەکە ڕاستکراوەتەوە.

باسی دووەم: ڕۆڵی هەژار لە قووڵکردنەوەی کێشە و ناکۆکییە ناوخۆییەکان، کە تێیدا بەشێک لەو دەقانە وەرگیراوە کە هەژار نووسیویەتی وەکوو بەشێک لە قووڵکردنەوەی کێشە و ناکۆکییە ناوخۆییەکانی باشووری کوردستان.

باســـی ســـێیەم: وەرگێڕانـــی شـــەرەفنامە لای هەژار موکریانی، کە تێیدا بەراوردی دەقی تەرجەمەکراو بە دەقی ڕەسەن کراوە و بەشێک لە هەڵەکانی دەستنیشـان کراوە و دروستەکەشی لە بەرانبەر دانراوە.